# لێکچوونەکانی نێوان ڕافیزە وجوولەکە

له کتێبی منهاج السنةی
شیخ الاسلام ابن تیمیة وەرگیراوه

وەرگێڕانی/خانی کوردستانی

1437 کۆچی

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی :

ئەم نامیلەکەیەی لەبەر دەستتاندایە بریتیە لە کۆمەڵێك لێکچوونی نێوان شیعەی ڕافیزە و جوولەکە کە شیخ الاسلام ابن تیمیة ﴿ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت﴾ لە کتێبی ﴿منهاج السنة النبویة﴾دا بە ڕوونی و زۆر بە چاکی ڕەددی شیعەی تێدا داوەتەوە و ڕووە پیسەکەیانی دەرخستووە ، ئەم چەند لاپەڕەیەشم لە کتێبەکە وەرگرتووە تا بە کورت و پوختی بۆتان دەربکەوێت کە کێن ئەوانەی لەلایەن کۆمەڵێك حزب و کەسەوە بە ﴿حضرة الإمام﴾ [1] بانگدەکرێن و بە کەسانێکی بەرگریکار لە دۆسیەی فەلّەستین و موسڵمانان دادەنرێن!

[1] عەلی باپیر سکرتێری کۆمەڵ لە چاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ کەناڵی سەحەری ئێرانی مەجوسی بەم شێوەیە ناوی ناوی خومەینی مەلعون دەهێنێت و دەڵێت : ئیمام خومەینی ڕەحمەتی خوای لێبێت . کە هیچ شاراوە نییە خومەینی مەلعون بە ئاشکرا جنێو بە هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و عائشة خاتوونی خێزانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و دایکی باوەڕداران دەدات و تۆمەتی زینای دەداتە پاڵ ، سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوًّا كَبِيرًا .

## لێکچوونەکانی نێوان ڕافیزە و جوولەکە :

﴿کتێبی منهاج السنة ڕەددانەوەی شیخ الإسلام ابن تیمیتیە بۆ کتێبی (منهاج الکرامة في معرفة الإمامة)ی یەکێك لە زانا ڕافیزییەکان بەناوی (یوسف ابن مطهر الحلي) / وەرگێڕ﴾

شیخ الإسلام ابن تیمیة دەفەرموێت : ئەم دانەرە کتێبەکەی ناوناوە (منهاج الکرامة في معرفة الإمامة) کە وا باشتربوو ناوبنرایە : (منهاج الندامة) ، هەروەکو ئەو کەسەی کە بانگەشەی پاکی دەکات و لەوانەیە کە خوا نایەوێت دڵیان پاك ببێتەوە ، بەڵکو لە ئەهلی جبت و طاغوت و دووڕووین ، وەسفکردنی ئەو کەسە بە پیسی و لێڵکردنی بابەتەکان زۆر باشترە لە وەسفکردنی بە پاکی و پوختی .

لە گەورەترین پیسییەکانی دڵیش بریتیە لەوەی کە کەسێك ڕقی لە دڵدا بێت بەرانبەر بە باشترینی باوەڕداران و خۆشەویستەکانی خوا لە دوای پێغەمبەران ، هەر لەبەرئەوەشە خوای پەروەردگار هیچ شتێکی زیادەی دانەناوە بۆ ئەوانەی کە دوای ئەو خۆشەویستانەی خوا دێن مەگەر ئەوەندەی کە بڵێن : رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالإِيمَانِ وَلا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلاًّ لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ . ﴿الحشر : 10﴾ . واتە : ئەی خوای پەروەردگار لێمان خۆش ببە و لەو برایەنەشمان خۆش ببە کە پێش ئێمە کەوتوون لە باوەڕهێناندا هیچ ڕق و کینەیەك مەخەرە دڵمانەوە دەربارەی باوەڕداران ئەی پەروەردگارمان بە ڕاستی هەر تۆی دڵسۆز و میهرەبانی .

لەبەر ئەم هۆکارەیە کە کۆمەڵێك لێکچوونی زۆر لە نێوان ئاکار و ڕەوشتەکانی ڕافیزە و جوولەکەدا هەیە لە شوێنکەوتنی هەواو ئارەزوو و  زۆری تریش لە ڕەوشتەکانی جوولەکە ،

به هەمان شێوەش کۆمەڵێك لێکچوونیان لەگەڵ گاووردا هەیە لە ڕووی زیادەڕۆیی و نەزانی و شوێنکەوتنی هەواو ئارەزوو کۆمەڵێك سیفەت و ڕەوشتی تر لە ڕەوشتەکانی گاوور[2] ، هیچ کۆمەڵ و دەستەیەك بە وێنەی ڕافیزە لە جوولەکە و گاوور ناچن لەو ڕووانەوە ، هەتا ئێستاش هەر بەو وەسفانە وەسف دەکرێن کە لە گاوور و جوولەکەدا هەن .

لەو کەسانەی کە زۆر چاك لە ناوەڕۆکیان تێگەیشتووە شەعبییە کە یەکێکە لە زاناکانی خەڵکی کوففە .

عن الشعبي أنه قال : ما رأيت أحمق من الخشبية لو كانوا من الطير لكانوا رخما ولو كانوا من البهائم لكانوا حمرا والله لو طلبت منهم أن يملئوا لي هذا البيت ذهبا على أن أكذب على علي لأعطوني ووالله ما أكذب عليه أبدا .

ئیمامی شەعبی فەرموویەتی : هیچ کەسێکم نەدیوە لە خشبیەکان[3] گەمژەتربێت ، ئەگەر بیانچوێنیت بە باڵندەکان ئەوا رەخمن ﴿رخم : باڵندەیەکە و لە عەرەبیدا بۆ کەسێك بەکاردێت کە هیچ خێرێکی تێدا نەبێت/وەرگێڕ﴾ ، ئەگەر لە ئاژەڵیش بن ئەوە گوێدرێژن ، سوێند بەخوا ئەگەر داوایان لێ بکەم ئەم خانووەم بۆ پڕ بکەن لە ئاڵتوون بەس بۆئەوەی کە درۆیەك بەدەم عەلییەوە بکەم بۆم دەکەن ، سوێند بەخوا هەرگیز درۆی بە دەمەوە ناکەم .

---

[2] خوای تعالی لە ئایەتی 7 لە سورەتی الفاتحةدا دەفەرموێت : غير المغضوب عليهم و لضالين. زانایان دەفەرموون: ﴿المغضوب عليهم﴾ جوولەکەن هەروەکو خوای تعالی دەفرموێت : من لعنه الله و غضب عليه﴿المائدة:60﴾ ، هەروەها ﴿الضالين﴾ گاوورن هەروەکو خوای تعالی دەفەرموێت : قد ضلوا من قبل و أضلوا كثيرا و ضلوا عن سواء السبيل﴿المائدة:77﴾ . جوولەکە زانابوون و کاریان بەو زانستە دینییەکە نەدەکرد کە پێیان درابوو لە ئەنجامدا خوا غەزەبی لێگرتن ، گاووریش نەزانبوون و بە هەواوهەوەسی خۆیان کاریان دەکرد لە ئەنجامدا گومڕابوون .(وەرگێڕ)

[3] خشبیەکان : کۆمەڵێکن لە کۆمەڵەکانی ڕافیزە و باوەڕیان وایە کە جیهاد بوونی نییە هەتا مەهدی چاوەڕوانکراو دێت و بۆیە بەوناوەشەوە ناونراون چونکە شمشێرەکانیان لە دار دروستکردووە بەواتای ئەوەی ناجەنگێن هەتا ئەو کاتە .

ئەم قسەیەش بە درێژی لێیەوە گێڕاویانەتەوە ، بەڵام گێڕانەوە درێژەکە وتەی بێجگە لە خۆیەتی .

أبو حفص بن شاهين في كتاب اللطيف في السنة حدثنا محمد بن أبي القاسم بن هارون حدثنا أحمد بن الوليد الواسطي حدثني جعفر بن نصير الطوسي الواسطي عن عبد الرحمن بن مالك بن مغول عن أبيه قال قال لي الشعبي أحذركم هذه الأهواء المضلة وشرها الرافضة لم يدخلوا في الإسلام رغبة ولا رهبة ولكن مقتا لأهل الإسلام وبغيا عليهم قد حرقهم علي رضي الله عنه بالنار ونفاهم إلى البلدان منهم عبد الله ابن سبأ يهودي من يهود صنعاء نفاه الى ساباط وعبد الله بن يسار نفاه إلى خازر .

أبو حفص ابن شاهين لە کتێبی ﴿اللطف في السنة﴾دا گێڕاویەتییەوە : **محمد** بن أبی القاسم بن هارون پێی وتین ، احمد بن ولید الواسطي پێی وتین ، جعفر بن نصیر الطوسي الواسطي پێی وتم ، لە عبدالرحمن بن مالك بن مِغْوَلەوە ، ئەویش لەباوکییەوە کە وتوویەتی ، شەعبی فەرموویەتی : ئاگاداری گومڕاترین و خراپترین کەس بن کە ڕافیزەن ، کە نە بە ئارەزووی خۆیان و نە بەزۆریش هاتوونەتە ناو ئیسلامەوە ، بەڵکو لەبەر ڕقی خۆیان و بۆ تۆڵەسەندنەوە لە بەرانبەر ئەهلی ئیسلام هاتوونەتە ناو ئیسلام ، عەلیش ڕەزای خوای لێبێت سوتاندوونی و دووری خستونەتەوە بۆ وڵاتانیتر .

لەوانە عبداللە بن سبأی دوورخستەوە بۆ ساباط کە لە جوولەکەی صنعاءە ، هەروەها عبداللە بن یساری دوورخستەوە بۆ خازر .

ئەمەش کۆمەڵێك لەو نیشانانەیە کە دەریدەخات ئەو دەردەی لە ڕافیزەی داوە هەمان ئەو دەردەیە کە بە جوولەکەوەیە :

1- جوولەکە دەڵێن : پاشایەتی تەنها بۆ خێڵی داوودە ، ڕافیزەش دەڵێن پێشەوایەتی تەنها بۆ نەوەکانی عەلییە .

2- جوولەکە دەڵێن : جیهادکردن لە پێناوی خوادا نییە هەتا مەسیحی دەججال دێت و شمشێر لە ئاسمانەوە دادەبەزێت ، بە هەمان شێوە ڕافیزە دەڵێن : جیهادکردن لە پێناوی خوادا نییە هەتا مەهدی دێت و بانگدەرێك لە ئاسمانەوە بانگ دەکات .

3- جوولەکە نوێژ دوادەخەن بۆ کاتی دەرکەوتنی ئەستێرە ، بەهەمان شێوە ڕافیزە ، بە پێچەوانەی فەرموودەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کە دەفەرموێت : لا تزال أمتي على الفطرة مالم يؤخروا المغرب إلى اشتباك النجوم . واتە : هێشتا ئوممەتەکەم هەر لە خێردان ئەگەر نوێژی ئێوارە دوانەخەن بۆ کاتی دەرکەوتنی ئەستێرەکان .

4- جوولەکە کەمێك لە قیبلە لادەدەن ، بەهەمان شێوە ڕافیزە .

5- جوولەکە لە کاتی نوێژدا سەر و ملیان دەجوڵێنن و خۆیان ڕادەژەنن ، بەهەمان شێوە ڕافیزە .

6- جوولەکە لەکاتی نوێژدا جلەکەیان دەدەن بەسەر شانیاندا ، پێم گەیشتووە﴿ئیمامی ابن تيمية ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرموێت﴾ کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بەلای پیاوێکدا ڕۆیشتووە کە جلەکەی دابوو بەسەر شانیدا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم جلەکەی لێی کردۆتەوە ، بەهەمان شێوە ڕافیزە .

7- جوولەکە عیددەی ئافرەت حساب ناکەن و وای نابینن کە هەبێت ، بەهەمان شێوە ڕافیزە .

8- جوولەکە دەستکاری قورئانیان کرد و گۆڕییان ، بەهەمان شێوە ڕافیزە دەستکاری قورئانیان کرد و گۆڕییان .

9- جوولەکە دەڵێن : خوا پەنجا نوێژی لەسەر فەرز کردووین ، بەهەمان شێوە ڕافیزە .

10- جوولەکە بە تەواوی دان بە سەلامدا نانێن لە بەرانبەر باوەڕداراندا بەڵکو دەڵێن : سام علیکم واتە : دەردو نەخۆشیتان لێبدات ، بە هەمان شێوە ڕافیزە .

11- جوولەکە نوێژەکان کۆدەکەنەوە و لە سێ کات زیاتر نوێژ ناکەن ، بەهەمان شێوە ڕافیزە .

12- جوولەکە لە نوێژی بەیانیاندا لەسەر ناوچەوان سەجدە دەبەن و ڕووی دەموچاویان بەرز دەکەنەوە ، بەهەمان شێوە ڕافیزە .

13- جوولەکە جەرا[4] و مارماسی و کەروێشك و قەوزە ناخۆن و بە حەرامی دەزانن ، بەهەمان شێوە ڕافیزە .

14- جوولەکە وای نابینن کە سڕینی سەر گۆرەوی﴿مسح على الخفين﴾ هەبێت ، بەهەمان شێوە ڕافیزە .

15- جوولەکە ماڵی هەرچی کەس هەیە بە حەڵاڵی دەزانن ، بەهەمان شێوە ڕافیزە ، خوای پەروەردگاریش لە قورئاندا هەواڵیانی پێداوین کە دەڵێن : لیس علينا في الأميين

---

[4] جۆرێکی ماسییە ، ڕافیزە دەڵێن : ماسییەك گفتوگۆی لەگەڵ عەلیدا کردووە لەوانەیە یەکێك لەو دوو جۆرە ئەو بێت .

سبیل . واتە : لەبەرانبەر ئەو نەخوێندەوارانەدا لێپرسینەوەمان لەگەڵدا ناکرێت ﴿ئەگەر فێڵیان لێبکەین و ماڵیان بخۆین﴾ .

16- جوولەکە لەکاتی نوێژدا لەسەر باسك سەجدە دەبەن ﴿واتە ئانیشکیان دەخەنە سەرزەوی وەکو دەست دانانی سەگ﴾ ، بەهەمان شێوە ڕافیزە .

17- جوولەکە سەجدە نابات بەڵکو چەند جارێك سەری دادەنەوێنێتەوە وەکو رکوع ، بەهەمان شێوە ڕافیزە .

18- جوولەکە ڕقی لە جبریلە و دەڵێن : ئەو لەناو فریشتەکاندا دوژمنی ئێمەیە ، بەهەمان شێوە ڕافیزە دەڵێن : جبریل بەهەڵەداچوو کە نیگای بۆ محمد هێنا .

19- جوولەکە خوێنی هەموو موسڵمانێك بە حەڵاڵ دەزانن ، بەهەمان شێوە ڕافیزە .

20- جوولەکە فێڵ و غەشکردن بە شتێکی ئاسایی دەزانن ، بەهەمان شێوە ڕافیزە .

21- جوولەکە دەڵێن : طلاق بە شاهد نەبێت ناکەوێت ﴿واتە دەبێت شاهد هەبێت کە ئەو کەسە طلاقی خواردووە﴾ ، بەهەمان شێوە ڕافیزە .

22- جوولەکە طلاق خواردن لەکاتی حەیزی ئافرەتدا بەکەوتوو دانانێن ، بەهەمان شێوە ڕافیزە .

23- جوولەکە هیچ سنوور و خۆگرتنەوەیەکیان نییە لەکاتی سەرجێیدا ، بەهەمان شێوە ڕافیزە .

24- جوولەکە پەلکی تەڕ دەخەنە ناو کفنی مردووەکانیانەوە ، بەهەمان شێوە ڕافیزە .

25- جوولەکە مارەییان بۆ ژنەکانیان نییە بەڵکو هەر لەگەڵیاندا ڕادەبوێرن و تەواو ، بەهەمان شێوە ڕافیزە هەر بۆماوەیەکی کاتی لەگەڵیاندا ڕادەبوێرن و هاوسەرگیری چێژ وەرگرتن(زواج المتعة)یان بۆ خۆیان حەڵاڵ کردووە.

26- جوولەکە و گاوور بە دوو سیفەت پلەیان لە ڕافیزە بەرزترە : پرسیار لە جوولەکە کرا کە باشترین کەسانی میللەتی ئێوە کێن؟ وتیان : هاوەڵانی موسان ، پرسیاریش لە گاوور کرا کە باشترین کەسانی میللەتی ئێوە کێن؟ وتیان : هاوەڵانی عیسان ، بەڵام پرسیار لە ڕافیزە کرا کە خراپترین کەسانی میللەتی ئێوە کێن؟ وتیان : هاوەڵانی محمدن .

ڕافیزە فەرمانیان پێکرا بە داواکردنی لێخۆشبوون بۆیان کەچی لە بەرانبەردا جنێویان پێدان.

ڕافیزە ئەهلی حەربن و شمشێریش لەسەریان هەڵکێشراوە هەتا ڕۆژی قیامەت ، نابێت هیچ ئاڵایەکیان بۆ بەرزبکرێتەوە و پێیان دامەزراو بکرێت و قسەیان یەکبخرێت ، وەڵامی بانگێشتیان نادرێتەوە .

بانگەوازیان شکست خواردووە ، قسەیان جیاوازە ، کۆبوونەوەیان شپرز و بڵاوە ، ﴿كلّما أوقدوا نارا للحرب أطفأها الله/ هەرکاتێك ئاگرێك هەڵبگیرسێنن بۆ شەڕ خوا دایدەمرکێنێتەوە﴾ .

وصلى الله على نبينا محمد و على آله و صحبه أجمعين

و آخر دعوانا أن الحمدلله ربّ العالمين

لە دوعای خێر بێبەشمان مەکەن